# قورِئان چەكی برِوادارانە

## نووسینی: هێمن عبدالعزیز

قــورِئان خوێــندن پیــشەی كەڵــە پــیاوان و مەشـــخەڵی رِێ ناســــینە.. رِەمــــزی ناســــینەوەی لـــە خـــوا تـــرس و عارفیـنە..قـورِئان ژیانـە.. قـورِئان گیانە.. چرای نیوە شەوی خـوا ناسـانە.. داینەمۆی هێزی عیززەت و سەر بەرزی دینە.. وورەی پۆلایــینی پــیاوانی لـــە خـــوا تـــرس و شـــێرزادەی نەبەردیـنە.. تەقـوا دارانی رِێگـەی خـوا چـاك لـە قـورِئان گەیـشتوون ، بـۆیە هـەر خوا پاراستنی قورِئانی پێ لە ئەستۆ گـرتوون.. گەلێكـیش لە گەڵ قورِئان بژیەت هەر سەربەرزە.. هەر سەر بڵندو قارەمان و نەبەزە..

دەجا با بنۆرِین و بزانین و لێ ی ووردەوەبین، سەرنج دەین كـە قـورِئان چـی یـەو بایـەخ و پلـەو پایەی لەشەرع دا چییەو وورد بوونەوە لێ ی چی یە؟

لە قورِئاندا

**خوای گەورە دەفەرموێ:**

١. ﴿ إِنَّـــا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾ الحجر:٩. واتە: بەرِاستی هــەر ئــێمە قــورِئانمان دابەزانــدووەو هــەر بــۆ خــۆشمان

پارێزگاری لێ ئەکەین.

٢. ﴿ أَوْزِدْ عَلَــيْهِ وَرَتِّــلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً ﴾ المزمل:٤. واتـە: یاخود زیاتری بکەو دەوری قورئان بکەوە.

٣. ﴿ فَــإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ﴾ القيامة:١٨. واتـە: کـاتێ کـە قورئانمان خوێندەوە تۆش بەدوایا بیخوێنەوە.

٤. ﴿ الَّــذِينَ آتَيْــنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاوَتِهِ أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَــئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴾ البقرة:١٢١. واتـە: دەسـتەیەک لەوانەی کە کتێــبمان پــێ بەخــشیون، بــە چــاکی و بــە ووردی دەوری دەکەنـەوە، ئەوانـە باوەڕیـان پـێی هەیە، بەڵام ئەوەی بڕوای پێی نەبێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە لە خەسارەت مەندو زەرەر مەندەکانن.

٥. ﴿ وَإِذَا قُــرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الأعراف:٢٠٤. واتـە: هـەر کـاتێ کـە قـورئان خوێنـرا، گـوی بـۆ بگـرن و بـێ دەنگ بن، بەڵکو پەروەردگار بەزەیی پیاتان بێتەوە.

٦. ﴿ وَإِذَا تُلِــيَتْ عَلَــيْهِمْ آيَاتُــهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً ﴾ الأنفال:٢. واتە: کاتێ کە ئایەتیان بەسەر دا بخوێنرێتەوە ، باوەڕیان زیاد ئەکات.

## پلەو پایەی قورئان خوێندن لە سوننەتدا

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ:

١. ( اقْرَؤُا القُرْآنَ فإِنَّهُ يَأْتي يَوْمَ القيامةِ شَفِيعاً لأصْحابِهِ ) رواه مسلم  عن أَبي أُمامَةَ ﷺ واتــه: قــورِئان بخويـِّنــنهوه، چــونكه لــه ڕۆژی دوایــی (قورِئانهكه ) دیّتهوه شهفاعهت ئهكات بۆ خاوهنی.

٢. ( خَيرُكُــم مَــنْ تَعَلَّمَ القُرْآنَ وَعلَّمهُ ) رواه البخاري عن عثمانَ بن عفانَ ﷺ.

واتـه: چـاكترينتان ئهوانـهن كه فـێری قورِئان خوێندن بێت و خهڵكيش بههرهوهر بكات له خوێندنی.

٣. ( مــنْ قرأَ حرْفاً منْ كتابِ اللَّهِ فلَهُ حسنَةٌ ، والحسنَةُ بِعشرِ أَمثَالِهَا لا أَقول : الم حَــرفٌ ، ولَكِن : أَلِفٌ حرْفٌ، ولامٌ حرْفٌ ، ومِيمٌ حرْفٌ ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح عن ابن مسعودٍ ﷺ. واتـه: هـهر كهسێكی یهک پيت لـه كتـێبی خـوا بخوێنێتهوه، چاكهیهكی بۆ ئهنووسرێت، هـهر چـاكهیهكيش ده خێـری وهک خـۆی بـۆ هـهیه، مـن ناڵێم كه : (الم ) پيتـێكه، بهڵكـو: ئهلـيف پيتـێكهو لام پيتـێكهو ميمـيش پيتێكه.

٤. ( يُقَــالُ لِــصاحبِ الْقُرَآنِ : اقْرأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَما كُنْتَ تُرَتِّلُ في الدُّنْيَا ، فَإِنَّ منْــزِلَتَكَ عِــنْدَ آخرِ آيةٍ تَقْرَؤُهَا ) رواه أَبو داود ، والترْمذي وقال : حديث حسن صــحيح عن عبدِ اللَّهِ بنِ عَمْرو بن العاصِ رضي اللَّه عنهما. واته: به قورِئان خوێـنان ئهگوتـرێ: قورِئان بخوێنهوه و ترس بنوێنهو جوان دهوری كـهوه، هـهروهک لـه دونـيا بـه جـوانی ئهتخوێندهوه، چونكه پلهو مهقامی تۆ لای دوا ئايهته كه ئهیخوێنیتهوه.

٥. ( مَثَلُ المؤمنِ الَّذي يقْرَأُ القرآنَ مثلُ الأُتْرُجَّة : رِيحهَا طَيِّبٌ وطَعمُهَا حلْوٌ ، ومثَلُ المــؤمنِ الَّذي لا يَقْرَأُ القُرْآنَ كَمثَلِ التَّمرةِ : لا رِيح لهَا وطعْمُهَا حلْوٌ ، ومثَلُ المُنَافِقِ

الـــذي يَقرَأُ القرآنَ كَمثَلِ الرِّيحانَةِ : رِيحها طَيّبٌ وطَعْمُهَا مرٌّ ، ومَثَلُ المُنَافقِ الذي لا يَقْــرَأُ القرآنَ كَمَثَلِ الحَنْظَلَةِ : لَيْسَ لَها رِيحٌ وَطَعمُهَا مُرٌّ ) متفقٌ عليه عن أَبي موسي الأشْــــعريِّ ﷺ. واتــه: ویـــنەی ئـەو بـڕوادارەی کـە قـوڕئان ئەخوێنیـتەوە وەک نـارنج وایە، کە بۆنی خۆشەو تامەکەشی هـەر خۆشـە، هـەروەها ویـنەی ئـەو بـڕوادارەی قـوڕئان ناخوێنیـتەوە، وەک دەنکە خـورما وایە، کە بۆنی نیە، وەلێ تامـی هەیـە، وە ویـــنەی ئـــەو دوو ڕووەی کـــە قـــوڕئان ئەخوێنیـتەوە، وەک ڕەیحـان وایـە، کـە بـۆنی خۆشـەو وەلێ تاڵـە، وە ویـنەی ئـەو دوو ڕووەی کـە قـوڕئان ناخوێنیـتەوە، وەک گوژاڵک وایە کە نە بۆنی هەیەو زۆر تاڵیشە.

## لەبەر کردنی قوڕئان:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ:

١. ( تَعاهَـــدُوا هذا الْقُرآنَ فَوَالَّذي نَفْسُ مُحمَّد بيدِه لَهُو أَشَدُّ تَفَلُّتاً مِنَ الإِبلِ في عُقُلِها ) متفق عليه عَنْ أَبي مُوسَي ﷺ. واتـه: بەردەوام بن لەسەر دەور کـــردنەوەی قـــوڕئان، ســـوێند بـــەو کەســـەی کـــە گـــیانی مـوحەممەدی بەدەستە، زووتـر لـە دەسـت دەر ئەچـێت لـەو حوشـترەی زیاتـر کـە جلـەوی لەدەسـت ئـەدرێ و ( ڕا ئـەکاو ناگیرێتەوە ).

٢. ( إنَّ الَّـــذي لَـــيس في جَوْفِهِ شَيْءٌ مِنَ الْقُرآنِ كالبيت الخَرِب ) رواه الترمذي وقـــال: حـــديث حـــسن صحيح عنِ ابنِ عباسٍ رضيَ اللَّه عنهما. واتـه: ئـەو

کەسەی کە هیچ شتێک لە قورئانی لە سینگ دا نی یە، وەک خانوویێکی وێران وایە.

## دەنگ خۆش کردن لە قورئان:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ:

١. ( مَـــا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ يَتَغَنَّي بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ ) متفقٌ عليه عَنْ أبي هُرَيْرَةَ ﷺ . واتە: خوا گوێ ی نەگرتووە لە هیچ شتێک وەک کە گوێ ی گرتووە لە دەنگ خۆشی پێغەمبەرەکەی کاتێ کە قورئان بە دەنگێکی بەرزو خۆش ئەخوێنێتەوە.

٢. ( لَقَـــدْ أُوتِيتَ مِزْمَاراً مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُد ) متفقٌ عليه عن أبي موسي الأشْعَرِيِّ ﷺ. واتە:( ئەی ئەبو موسا ) ، تۆ دەنگ خۆشی دەنگ خۆشانی ئالی داودت پێ براوە. وە لە ڕیوایەتی مسلم هاتووە کە دەفەرموێ : ( لَـــوْ رَأَيْتَنِـــي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ البارحَةَ ). واتە: گەردوێ ئەتبینیم کە گوێم لە خۆش خوێندنەوەکەی تۆ گرتبوو ( ئەم زانی کە چیت ئەکردا! )

٣. ( عَنِ الْبَرَاءِ بنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عنهمَا قالَ : سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَرَأَ فِي العِشَاءِ بِالتِينِ والزَّيْتُون ، فَمَا سَمِعْتُ أَحَدَاً أَحْسَنَ صَوْتَاً مِنْهُ . متفقٌ عليه .) واتـــة: لـــة عَنِ الْبَرَاءِ بنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عنهمَا دەگێڕنەوە دەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو کە لە نوێژی خەوتنان سورەتی ( والتين والزيتون ) ی دەخوێندەوە، گوێم لە کەس نەبووە کە وەک ئەم دەنگی خۆش بێت .

٤. ( مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ فَلَيْسَ مِنَّا ) رواهُ أبو داود بإسنادٍ جيد عَنْ أَبِي لُبَابَة بَشِير بنِ عَبْدِ الْمُنْذِرِ. واتـه: ئەو كەسەی دەنگی خۆی لە قورئان خۆش نەكات لە ئێمە نیە.

٥. ( عَـــنْ ابْـــنِ مَسْعُود ﷺ قالَ : قَالَ لِي النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم: ( اقْرَأْ عَلَيَّ الْقُرْآنَ ) ، فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ الله ، أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ ؟! قَالَ : ( إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي ) فَقَرَأْتُ عَلَيْه سُورَةَ النِّسَاءِ حَتَّي جِئْتُ إلي هذه الآيَة : ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّة بِشَهِيد وَجِئْنَا بِكَ عَلَي هؤُلاء شَهِيدًا ﴾ قالَ : ( حَسْبُكَ الآنَ ) فالْـتَفَتُّ إِلَـيْهِ ، فَـإِذَا عَيْـنَاهُ تَـذْرِفَان . مـتفقٌ عليه. واتة: لة ابن مسعود ﷺ دەگێڕنەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر صـلی الله علـیه وسـلم پێی فەرمووم: قورئانم بە سەردا بخوێنە! ئەڵێ: گوتم: قورئانت بە سەردا بخوێنم كەچی قورئان بە سەر تۆ دابەزیوە؟ پێغەمبەریش صـلی الله علـیه وسلم فەرمووی: پێم خۆشە كە لە غەیری خۆم گوێم لێ ی بێت! ئەڵێ : منیش دەستم كرد بە قورئان خوێندن لە سورەتی ( النساء ) پێ یدا هەڵچنیم، تا گەیشتمە ئایەتی : ﴿ فَكَـيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَي هَؤُلاء شَهِيدًا ﴾ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ئیتر بەسە! دەڵێ: منیشم ئاوڕم لێ ی دایەوە بینیم كە چاوەكانی پڕ بوو ون لە گریان. رواه البخاري.

## ڕەوشت وئادابی قورئان خوێندن

قـورِئان خوێندنـیش وەک باقـی بەندایـەتی یەکانی تر ، ئەبێ ڕەچـاوی ئـادابی خوێـندن بکـرێت، بەشـێکیش لەو ڕەوشت و ئادابانە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم**: یەکەم ڕەوشت بۆ قورِئان خوێندن وا چاکە کە دەست نـوێژت هەبـێت لـە ڕووی ئەدەبـەوە، ( نالـێم واجـبە )، هـەر چـەند بـە پـاڵ کـەوتن و ڕاکـشانیش هــەر درووســتە کــە بخوێـنـرێت، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّــهَ قِــيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَي جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ آل عمــران: ١٩١. واتـە: ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن ( لە کاتێکدا کـە) بـە پـێ وەن یـان دانیشتوو ون یا ڕاکشاون ، وە هەمیشە بیر دەکەنەوە لە درووست بوونی ئاسمانەکان و زەوی.

**دووەم**: دیـار کـردنی ئەنـدازەی خوێـندن: چـونکە قـورِئان خوێـنان هـەر یـەک بـە ئەندازەیـەک دیـاری کـراو قورِئانـیان خـەتم کـردووە. بـۆ نمـوونە: ( عثمان بن عفان و ابن مسعود و ابي بن كعــــــب ﷺ ) هەمـــوو هەفـــتەیەک خەتمێکــیان کــردووە و قورئانیان دابەش کردبوو بۆ حەوت حیزب.

**سێ یەم**: جوان خوێندن ( الترتيل ): واتە خوێندنەوەیەک کە فەهمـی لە گەڵ بێت، هەروەک ابن عباس ﷺ دەفەرموێ: ( لإن أقرأ البقرة وآل عمران أرتلهما واتدبرهما أحبَّ اليَّ من أن أقرأ القرآن كلهُ هذرمة ).

واتـه: گـەر تـەنها سورەتی بەقەرەو ئالی عیمران بە تێگەیشتن بخوێـنمەوە پـێم خۆشـترە لەوە کە هەموو قورئان بە پەلە و داوان بخوێنمەوە.

**چـوارەم**: گـریان لـەگـەڵ خوێـندنی قـورئان: سوننەت وایە کە لەگـەڵ خوێـندنەوەی قـورئان هـەوڵ دەیـت کـە بگـرییت.. بەمـەش بیر لە بەڵێنەکان و ئاگری دۆزەخ و سەرەنجامەکانی ڕۆژی دوایـی زیاتـر ئەکرێتەوە.. ئیمامی غەزالیش ڕەحمەتی خـوای لـێ بـێت، دەڵـێت: گـەر قـورئانت خوێـند هـەوڵ دە کـە بگـریەیت، خـۆ ئەگـەر نەشـگریایت، ئـەوا بگـریە بەسـەر ئـەو دڵەی کە تا بە فەرمایشتی خواش نەرم نابێت و ناچڵەکێت.

**پێـنجەم**: سـوننەت وایـە کـە سەرەتای قورئان خوێندنەکە بە پەناگـرتنە بەر خوا دەست پێ بکەیت و بڵێیت: ( اعوذ بالله السميع العلـــيم مـــن الـــشيطان الرجيم من همزه ونفثه ونفخه ) ، خـوای گـەورەش دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا قُــرِئَ الْقُــرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الأعراف:٢٠٤. ( پێشتر لێک دراوەتەوە ).

**شەشەم**: ئـەبێ هـەقی هـەموو ئایەتەکان بدرێت: واتە: کاتێ کە ئەگـەیت بـە ئایـەتی سـوژدە سـوژدە بـەریت و بڵێـیت: ﴿ سَجَدَ وَجْهِــيَ لِلَّــذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ فَتَبَارَكَ اللهُ أحسنُ الخَــالِقِين ﴾ رواه أحمد. واتـە: ڕووم سـوژدەی برد بۆ ئەو خوایەی

کە بەدی هێناوەو شێوەی داوەتێ و وە بیستن و بینینی بۆ داهێناوە بە هەوڵ و توانای خۆی ، وەپیرۆزی بۆ ئەو خوایەی کە چاکترین بەدیهێنەرە. وە کە ئەگەیتە ئایەتی تەسبیح خوا بە پاک بگریت، کە ئەگەیتە ئایەتی ئاگر، پەنا بۆ خوا بەریت، کاتێ ئەگەیتە ئایەتی خواستن، چیت ئەوێ لە خوا بخوازە، کە ئەگەیتە ئایەتی ئیستیغفار داوای لێخۆش بوون لە خوا بکە، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم صلی الله علیه وسلم وای ئەکرد.

**حەوتــە**: خۆ دوور گرتن لە ڕوو پامایی ( الرياء ): خۆ ئەگەر بە تەنها بوویت چەندی ئەتوانی بۆت هەیە کە دەنگی خۆت بەرز کەیتەوە لە کاتی قورئان خوێندنا، چونکە زۆر جاران خشوع بەدەنگ بەرز کردنەوە لای ئەو کەسە درووست ئەبێت ، ، وەلێ ئەگەر خەڵکیش و لێ نزیک بوو، وا چاکە کە دەنگی خۆت نزم کەیتەوە، لە ترسی ئەوە نەوەکا دوو چاری ڕوو پامایی ببیتەوە.

**هەشــتە**: دەنگ خۆش کردن بە قورئان وەک لە پێشەوە باسمان کرد. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُـــرْآنِ فَلَيْسَ مِنَّا ) رواهُ أبو داود بإسنادٍ جيد عَنْ أَبِي لُبَابَةَ بَشِير بن عَبْدِ الْمُنْذِرِ. ( پێشتر لێک دراوەتەوە )، یان دەفەرموێ: ( زينوا القرآن بأصواتكم

) رواه الــبخاري عــن البراء بن عازب. واته: به دەنگی خۆش قورئان بـڕازێننەوە. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەنگی خۆشی زۆر پێ خـۆش بـوو، بـۆیە کـە گوێـی لـە خوێـندنەوەی ( أبي موسى رضي الله عنه ) ئەبـوو دەیفەرمـوو: ( يا أبا موسي، لقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود) رواه البخاري. ( پێشتر لێک دراوەتەوە)

## کارە دەروونی یەکان لە کاتی قورئان خوێندندا

قـورئان خوێـندن کـارێ نـیە کـە تـەنها زمـان هـاتوو چۆی تیا بکـات و تـەنها چـەن سـاتـێکەو لـە گەڵـیا بژییتن نەخێر تەنها ئەمـە لـە قـورئان خوێـندندا مەتڵـەب نـیە، بەڵکـو ڕۆحـی ئـەم قــورئان خوێــندنە ووردبــوونەوەو قــاڵ بــوونەوەو کــار پــێ کـردنە. بـۆیە هەرکەسـێکی کـە ئەیـەوێ قـورئان بخوێـنێت بـا زۆر چـاک ئاگـاداری گرەوی بردنەوەی قورئان خوێندنەکەی بێت، کە ئەمانەی خوارەوەن:

١. تـێ گەیـشتن لـە فەزڵـی خـوا بـۆ بەنـدەکانی. کـە قـورئان فەزڵـێکەو زامـنی وەرگـرتنی کارەکانەو مایەی ساڵح بوون و بەرەو خوا چوونە.

٢. گەورەیـی خـوا لە قورئان خوێندنەوەکەتدا بەدی بکەیت. کـاتێ کـە دەسـت بـە خوێـندنەوەی قـورئان ئەکەیت پێویسته خـاوەنی ئایەتـەکان کـە خـوایە هـەردەم لـە دڵـتدا بـێت و بـە

گەورەی بگریت و بزانیت کە ئەم فەرمایشتانە هی خوان و تۆ ئەیلێیتەوە.

٣. لە کاتی قورئان خوێندنەکەتدا دڵت هەر لە لای ئەو خوایە بێت.

٤. وورد بوونەوەو قاڵ بوونەوە لە کاتی خوێندن دا: هەروەک عەلی کوڕی ئەبی تاڵب ﷺ دەفەرموێ: ( لا خير في عبادة لا فقـه فيها ولا قراءة لا تدبر فيها ) واتە: خێر بەو بەندایەتیە وە نیە کە تێگەیشتنی تیا نەبێت و وە لەو قورئان خوێندنەوەی کە وورد بوونەوەی تیا نەبێت.
بۆیە ئەبینین و دەگێڕنەوە کە وا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وسلم یەک شەوی تەواو تەنها یەک ئایەتی لە نوێژێکا خوێندۆتەوە!

٤. تێگەیشت و ڕۆچوون بە نێو مانای ئایەتەکانی قورئان، بە تایبەت ئەو ئایەتانەی کە باس لە حاڵی خەڵکی ئەکات لە ڕۆژی دوایی و لەگۆڕەپانی مەحشەرو لە پردی سیراط و دۆزەخ و بەهەشت و... هتد. وەک خوای گەورە لە زۆر لە ئایەتەکانی هانی ئەم تێگەیشتنەمان ئەدات، بۆ نموونە دەفەرموێ: ﴿ أفرأيتم ما تحرثون ﴾ ﴿ أفرأيتم ما تمنون ﴾ ﴿ أفرأيتم الماء الذي تشربون ﴾. هەموو ئەم ئایەتانەی هان دانی ئاشکران کە

بەندەکان ئەبێ بەدەمیەوە بچن و لە ئایەتەکان چاک وورد ببنەوە.

٥. خۆ دوور گرتن لە مانای هەموو ئەو ئایەتانەی کە ڕێگری لەوە ئەکەن کە پەی بە ڕاستیەکەی بەریت، وەک بیر کردنەوە لە خودی خوا و بیر کردنەوە لە چۆنیەتی عەرشی خواو لە کەلامی و خواو لە دەست و قاچی خواو... هتد. تەنها ئەوەی کە لەسەر تۆیە ئەوەی کە باوەڕت پێ یان هەبێ کە هەن، بەبێ ئەوەی بزانیت کە چۆنیەتییەکەی چۆنە، وەک ئیمام مالک ( رحمه الله ) دەفەرموێ: ( والسؤال عنه بدعة ) واتە: پرسیار کردن دەربارەی چۆنیەتی بیدعەیە.

٦. کاتێ کە قورئان ئەخوێنیت وا بزانیت کە هەرچی ئایەت لەم قورئانە دا هاتووە، تێکڕا ڕووی دەمیان لە تۆیەو بۆ تۆ هاتوو ون. کەواتە: تێبفکرە و بزانە ئەوە بۆ تۆیەو پشتی تێ مەکەو جێ بەجێ ی بکە. وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَكُلّاً نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ هود:١٢٠. واتە: هەموو ئەوانەی کە بۆمان گێڕاویتەوە لە چیرۆک و هەواڵی پێغەمبەران، بۆ ئەوەیە کە دڵی تۆی پێ دابمەزرێنین و دڵنیات بکەین ، دڵنیاش بە کە لەم سوورەتە دا هەق و ڕاستیت بۆ هات و بۆت ڕوون کرایەوە، هەروەها ئامۆژگاری و بیر خستنەوەی باشی تیا بوو بۆ

بڕواداران.
یـان دەفەرمـویٚ: ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ ﴾ الأنعام: ١٩. واتـە: ئـەم قـورِئانەم بـە وەحـی و بە نیگا بۆ هاتووە، تا ئیٚوەو هەمـوو ئەوانـەی کـەپیٚ یـان ئـەگات ئاگـادار و بـیٚ دار بکـەم. هـەروەک محمد القرضي ( رحمه الله ) دەڵیٚ: ( من بلغ القرآن فكأنما كلمه الله ). واتە: ئەو کەسەی کەقورِئانی پیٚ ئەگات، وەک ئەوە وایە کە خوا قسەی لە گەل ئەکات.

٧. کـار کـردن لـە ژیانـت: ئـەبیٚ ئایەتەکان بەپیٚ ی حاڵەتەکان کـار بکەنـە سەر دڵ و زمان و کردەوی رۆژانەت. بۆیە هیٚندیٚ لـە زانایـان دەڵـیٚن: ئـەم قـورِئانە نامەیەکـە لـە لای خــوای گـەورەوە هاتـووە بـۆ سـەر بەنـدەکان ( تـا کـاری ڕاسـتەو خۆیان هەبیٚت لە ڕاستە ڕیٚ بوونی کردەوەکانی بەندە ).

٨. کـار کـردن بـە قـورِئان: کەسـانیٚ کـە قـورِئان ئەخویٚـنن و کـاری پـیٚ ناکـەن، بـا بـزانن، جگـە لەوەی کە ڕقی خوا لـەسەر خـۆیان زیـاد دەکـەن، لـە هـەمان کـات قـورِئان نەفرەتیان بۆ ئەنیٚـریٚ، وەک هیٚـندیٚ لـە زانایان دەفەرموون: بەندە قورِئان ئەخویٚـنیٚ کەچـی بـیٚ ئاگایـە کە نەفرەت ئەکات لە خۆی، ئەو نـازانیٚ کـە ئـەم ئایەتە ئەخویٚنیٚتەوە: ﴿ ألا لعنة الله علي الكاذبين ﴾ واتـە: نەفـرت لـە درۆزنـان بـیٚت، کەچـی خۆی ئەو درۆزنەیە،

یـان ئەم ئایەتە دەخوێنیتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿ الا لعنة الله علي الظـــالمين ﴾ واتـە: نەفرەتی خوا لە زۆرداران بێت، کەچی خۆی ئەو زۆردارەیە !!

## ئایا درووستە کە بازرگانی بە قورئانەوە بکرێت؟

هەڵبەت نەخێر، چونکە قورئان دەستووری ژیان و بەرنامەی سـاڵح بـوونی بەندەکانـە.. قـورئان بۆیە هاتووە تا خەڵکی بە بێ پارە چاک بوونی خۆیان تیا ببیننەوەو تاریکی بەرپێ یان ڕۆشــن کەنــەوە.. خەڵکــێک بــەبێ قــورئان بــژین، وەک مـردوویان لـێ دێ و ئـەو نرخ و بەهایەی کە خوا بۆی داناون لـێی بـێ بـەش ئـەبن و دەمـێ بـە کـەر دەمێ بەسەگ دەمێ بە ئاژەڵ سەیر ئەکرێن، خوا پەنامان بدات.

بـۆیە پێغەمـبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ( اقرؤا القرآن ولا تغلوا فـــيه ولا تجفوا عنه ولا تأكلوا به ولا تستكثروا به ) رواه أحمد عن عبد الرحمن بن شبل. واتـە: قـورئان بخوێنـنەوە و زێدە ڕەوی تیا مەکەن و لـێ ی سارد مەبنەوە، وە پێ ی مەخۆن و زیاد مەکەن.

کەسـانێک کـە مامەڵـە بـە قـورئان ئەکـەن، ئـەبێ بـزانن کـە چـەندین تـاوانی گـەورە لەئەسـتۆی خـۆیان ئەگرن، ئەوەندە بەسـە کـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ڕۆژی دوایی ئەم قـورئان هەڵگـرێت و شـەکوای خـۆی بەرز کاتەوەو حاڵی ئەم قــورئانە دە ئەســتۆی ئـێوە بگــرێت. وەک خــوای گــەورە

دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُوراً ﴾ الفرقان:٣٠. واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سكاڵا ئەكات و دەفەرموێ: پەروەردگارا بە ڕاستی گەلەكەم وازیان هێناوە لەم قورئانەو پشتگوێ یان خستووەو گرنگی پێ نادەن.
گەورەترین زیانیش كە بە قورئان ئەكەوێت ئەمانەی خوارەوەن:

١. ماهیەتی قورئان لە دەست ئەدرێت.
٢. قورئان نەفرەت ئەنێرێت، بۆ ئەو كەسە.
٣. زەلیلی جێگای عیززەتی لێ ئەگرێ.
٤. كۆسپ و تەگەرە لە ڕێگای بانگەوازی ئیسلامی درووست ئەبێت.
٥. پیرۆزی قورئان لە ئەدەست ئەدرێت.

## لا باسێك دەربارەی وورد بوونەوە لە قورئان ( التدبر فی القر*ن )

ابن القیم ( رحمه الله ) دەفەرموێ: ( التدبر ) بریتی یە لە تێ ڕامانێكی تیژ و چڕ بە ماناكانی و وە زەین دانێكی ووردو پەیوەست بوون پێیەوە.
یان دەڵێن ( التدبر ) واتە: تێفكرینێكی هەمەلایەنەو بەردەوام لە ئاخری دەقەكان و بۆچوونێكی دوور بۆ ماناكانی.

## حاڵەتی وورد بوونەوە لە قورئاندا:

خـوای گـەورە لـە زۆر لە ئایەتەکانی هـانمان ئەدات کە جوان لــە قــورئان وورد بیــنەوەو بــاش بـیری خــۆی بدەیـنێ، بــۆ نموونە دەفەرموێ:

١. ﴿ كِـــتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴾ صّ:٢٩. واتە: لە ڕاستی دا ئەم قورئانەی کە ڕەوانمان کردووە بۆت ( ئـەی پێغەمـبەر صلى الله عليه وسلم زۆر بـە فـەڕو موبارەکە، دەبا ئایەتـەکانی لـێک بدەنـەوەو بـیری لـێ بکەنـەو، دەبـا خـاوەن بیرو هـۆشـەکان یادەوەری وەرگرن و تێفکرن.

٢. ﴿ أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلافاً كَثِيراً ﴾ النـــساء:٨٢. واتـە: ئایا ئەوانـەی کـە سـەرنجی قورئان نادەن و لیـێی وورد نابـنەوە؟ خـۆ ئەگـەر لـە لایـەن کەسـێکی تـرەوە بـوایە جگـە لـە خـوا بـێگومان جیاوازیەکـی زۆریان تیا بەدی دەکـرد. ابــن كثير ( رحمه الله ) دەڵـێ: ئەمـە دەقێکـی ئاشکرایە کە وورد بوونەوە لە قورئان واجبە.

٣. ﴿ الَّـــذِينَ آتَيْـــنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاوَتِهِ أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَـــئِكَ هُـــمُ الْخَاسِـــرُونَ ﴾ البقرة:١٢١. واتـە: دەستەیەک لەوانەی کتێـــبمان پـــێ بەخـــشیون بەچـــاکی و بـــە ووردی دەوری

دەکەنـەوە، ئەوانـە باوەڕیان پێ ی هـەیە، بەڵام ئەوەی بڕوای پێی نەبێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە لـە خەسارەت مەندو زەرەر مەندەکانن.

ابـــن كـــثير (رحمه الله ) دەفەرموێ: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە! ( حق تلاوة ) ئەوەیە کە حەلالەکانی بە حەلال و حەرامـەکانی بـە حـەرام بـزانیت، وە بـەو چەشـنە قـوڕئان بخوێنیـتەوە کـە خـوا دایـبەزاندووە. هـەروەها (شەوکانی ) ( رحمـــه الله ) دەفەرمـوێ: ( يـــتلونه: واتـە: کـاری پـێ ئەکـەن ) فتح القدير.

٤. ﴿ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾ البقرة:٧٨.
واتـە: هـەندێ لەوانـە نەشـارەزاو نەخوێـندەوارن وا دەزانن کە جگە لە چەند ئاوات و هیوایەک هیچی تر نیە، ئەوانە هەر گومانیان کردۆتە پیشەی خۆیان.

شـەوکانی ( رحمه الله ) دەفەرمـوێ: ( الأماني ) واتـە: خوێـندنەوە واتە: زانیاریان نیە تەنها ئەزانن کە بیخوێننەوە بەبێ ئەوەی کـە بیری لێ بکەنەوە. ( فتح القدير ) هەروەها ابن القيم ( رحمه الله ) دەفەرمـوێ: خوای گەورە زەمی لادەران ئەکات ئەوانەی کە تەنها قوڕئان ئەخوێننەوە بە بێ حاڵی بوون لێ ی .

٥. ﴿ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُوراً ﴾ (الفرقان:٣٠)
( پێشتر لێک دراوەتەوە )

ابن كثير ( رحمه الله ) دەفەرموێ: ئەوانەن کە لە قورئان خوێندنەکەیان وورد نابنەوە، ئەمەیە مانای دوور کەوتوونەتەوە لە قورئان . ( تفسير ابن كثير )

## حاڵەتی وورد بوونەوە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ێلە* الله عليه وسلم

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ:

١. ( وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله، يتلون كتاب الله، ويتدارسونه بينهم، إلا نزلت عليهم السكينة، وغشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة، وذكرهم الله فيمن عنده رواه مسلم عن ابي هريرة ﷺ. واتە: هەر کۆمەڵێ لە ماڵێک لە ماڵەکانی خوا کۆ ببنەوەو کتێبی خوا ( کە قورئانە ) بخوێننەوە و لە نێوان خۆیان دیراسەی بکەن، ئەوا دڵنەوایان بۆ دێتە خوارەوە و بەزەیی خوا دایان ئەپۆشی، فریشتەکان دەوریان لێ ئەدەن، خوای گەورەش لای ئەوانە باس ئەکات کە لای ئەون .

٢. لە (حُذيفَة ) ڕەزای خوای لێ بێت، دەگێڕنەوە دەفەرموێ: ( صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيَّ صَلّي اللهُ عَلَيْه وسَلَّم ، ذاتَ لَيْلَة فَافْتَتَح البقَرَةَ ، فقلتُ : يَرْكَعُ عنْدَ المِـئَة ، ثُمَّ مضي ، فقلتُ : يُصَلّي بها في ركْعَةٍ ، فمَضَي ، فَقُلْتُ : يَرْكَعُ بها ، ثُمَّ

افْتَـــتَح النِّسَاءَ فَقَرأَهَا ، ثُمَّ افْتَتَح آلَ عِمْرَانَ ، فَقَرَأَها ، يَقْرَأُ مُتَرَسِّلاً إذا مَرَّ بِآيَة فِيها تَسْبِيحٌ سَبَّحَ ، وَإِذا مَرَّ بِسُؤَال سَأَلَ ، وإذا مَرَّ بِتَعوَّذ تَعوَّذَ ، ثُمَّ رَكَعَ ، فجعَل يَقُولُ : سُبْحَانَ رَبِّي العظِيمِ ، فَكَانَ رُكُوعُهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ ، ثُمَّ قال : سمِع اللَّه لِمَنْ حَمِدَه ، رَبَّـــنَا لَـــك الحْمدُ ، ثُمَّ قامَ طَوِيلاً قَرِيباً مِمَّا ركع ، ثُمَّ سَجد فَقَالَ : سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلَـــي فَكَـــانَ سَجُودُهُ قَرِيباً مِنْ قِيَامِهِ ) رواه مسلم. واتــه: شەوێ لەگەڵ پێغەمبەر صـــلى الله علـــيه وســـلم نـوێژم کـرد، ( دوای فاتـیحه ) سـورەتی ( البقـــرة ) ی خوێـندەوە، گـوتم: ڕەنگـه تـەنها سـەد ئایـەت بخوێنێـتەوە، کەچی لە سەد ڕەتی کرد، گوتم: ڕەنگە ( البقـــرة ) ی لـه هەموو نوێژەکە بخوێنێ، کەچی خەریک بوو، ( البقـــرة ) تـەواو کـات، گـوتم: ڕەنگـە تـەواو کـات ئـینجا بـچێتە رکـوع، کەچـی بەمەنـدە نەوەسـتاو سـورەتی ( النساء ) یشی بە دوا دا خوێند! نیسائی تەواو کردو ( آل عمران ) یشی دەست پێ کـرد، ئایـەت ئایـەت ئەیخوێـندەوە، کـە ئەگەیـشتە ئایەتـێک ( تـسبيح )ی تـیابا خـوای بـە پـاک ئەگـرت تـیایا، کـە گەیـشتبا ئایەتـێک کـە خواسـتی تـیابا، خواسـتی خـۆی ئەنواند، وە کە گەیشتبا ئایەتێک کە پەناگری تیابوایە، هانای بۆ خوا ئەبرد، پاشـان چـووە ڕکـوع و فەرمـووی: ( سبحان ربي العظيم )، کەچـی چـەمینەوەکەی بەئەنـدازەی وەسـتانەکەی بـوو؟!!، ئـینجا هەڵـسایەوە فەرمـووی: ( سمع الله لمن حمده، ربنا لك الحمد ) پاشان بە وەسـتاوی مایـەوە، کـە کـەمێ نـزیک بـوو لـە وەسـتان و چـەمینەوەکەی!! پاشـان بـۆ سـوژدە چوو و فەرموی: ( سبحان

ربي الأعلـــــي ) کەچـی سـوژدەکەی هـەمـدیس نـزیک بـوو لــە چەمینەوەکەی؟!!

٣. (عن جسرة بنت دجاجة رضي الله عنها، قالت سمعت أبا ذر يقول قام النبي ﷺ حـــتي إذا أصبح بآية والآية إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِـيمُ) رواه النـسائي. واتـە: لـە جـسرة بـنت دجاجـة رضي الله عنها دەگێـڕنەوە، دەڵـێ: گـوێم لـە أبـو ذر ﷺ بـوو، دەیفەرمـوو: پێغەمـبەر صـلى الله عليه وسلم شـەو بۆ شـەو نوێژ هەڵسایەوە تا بـەیانی ئایـەتی ﴿ إِنْ تُعَـذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ ی دەخوێندەوە.

**حاڵــەتی وورد بــوونەوە لای پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وسلم

ڕۆژێ پێغەمـبەر صلى الله عليه وسلم بەرنـوێژی بـۆ یارانی ئەکرد، لـە نوێژێکـی جەهـری دا و ئایەتێکـی پەڕانـدا! کـە لـە نـوێژ بـوویەوە، فەرمـووی: ئـەی فـلان کـەس مـن هـیچ ئایـەتم نەپەڕانـد؟ فـلان کەسیش گوتی: نازانم، لەیەکێکی تری پرسی؟ ئـەویش گـوتی: نـازانم، تـا لە سێ یەم کەسی پرسی، هەمدیس گـوتی: نـازانم! ئـەوە ئـەم گەلـە چـی بەسـەر هـاتووە؟ نازانن کەچـی خوێنراوەو چی تەرک کراوە؟! ئاخر بەم چەشنە بوو کە گەورەیی خوا لە دڵی بەنی ئیسرائیلی یەکان دەرچوو! کە بـە (لاشـە) لـە گەڵـی دابـوون و لـە دڵـیش بـێ ئاگـا بـوون لێی،

خـوای گـەورە لەبەنـدەی خـۆی قەبـول ناکـات کـە بـە (لاشـە) لەگەڵـی بـیت و لە دڵیش لێ ی بێ ئاگا بیت. ( عن أنس ﷺ في الموطأ )

## وورد بوونەوە لە دیدی خواناساندا:

١. قــورطبي ( رحمه الله ) دەفەرمـوێ: کەسـێک خوا حیکمەت و تێ گەیـشتن لـە قـوڕئانی پـێ ببەخـشێت، ئـەوا خـوا هەمـوو زانـستێکی پـێ بەخـشیوە، لـە زانـستەکانی پێـشی و ئێـستا. ( الجامع للقرطبي ).

٢. فــضيل بــن عياض (رحمه الله)، دەفەرمـوێ: فێری قوڕئان مەبن، تاکـو فێـری ئیعـڕاب و تەفـسیر و مـوحکەم و موتەشـابیهـ و ناسـخ و مەنـسوخ نـەبن، ئەگـەر ئـەوەتان زانی ئـەوە بێ نیاز ئەبن لە قسەکانی ( فضيل و ابن عيينة ).

٣. شــيخ الإســلام ابــن تيمــية و ابن القيم (رحمهما الله)، دەفەرمـوون: ئاخـاوتن و ماناکـانی قـوڕئان لەدەمـی پێغەمـبەر صلى الله عليه وسلم خۆیەوە وەر گرن.

٤. ابن القيم ( رحمه الله )، دەفەرمـوێ: یـارانی پێغەمـبەر صلى الله عليه وســلم هـیچ کتێبـێک و گوتەیەکـی لەبـەر کراویان لا نەبوو کە دیراسـەی بکەن ، تەنها قوڕئان نەبێت، کە لە پێغەمبەر ﷺ

الله علــيه وســلم يـان گـویٚ لـیٚ ئەبـووو ، کـە لـە گـەڵ یەکیش دا ئەنیشتن لە قورِئان زیاتر هیچ شتی تر نەبوو لە مەجلیسی دا کـە یـادی خـوای پـیٚ بکـەن. هـەروەها دەڵـیٚ: هـیچ شـتیٚک بـۆ ئینـسانەوە بەسـوود تـر نـیە کـە لەگـەڵ قورِئان بژیت و لیٚ ی وورد بیتەوەو مانای ئایەتەکانی نەکات.

٥. حسن البصري (رحمه الله) دەفەرمویٚ: قورِئان بۆیە هاتووە تاکو لیٚی ووردبیتەوەو کاری پیٚ بکەیت . ( مدارج الساكين ).

**حاڵەتی وورد بوونەوە لە سەردەمی زیٚرِینی ئیسلامی دا:**

١. **ابــن مــسعود** ﷺ دەفەرمـویٚ: هـەر لەیـەک لـە ئـیٚمە ئەگەر فیٚـری دە ئایـەت بـوایە، لەمـە تـیٚ پـەرِی نـە ئەکـرد تاکـو لـە ماناکانی نەگەیشتباو کاریان پیٚی نەکردبایە.

٢. **کە سورِەتی البقره ی تەواو کرد قوربانیەکی سەر برِی:** ابن عـومەر ﷺ دەفەرمـویٚ: ( عـومەر بـە مـاوەی دوانـزە سـاڵان فیٚـری سـورِەتی بەقـەرِە بـوو! کە تەواویشی کرد قوربانیەکی سەر برِی! ) نزهة الفضلاء .

٣. **کــار کردن بە قورِئان لە کیٚ و خویٚندنەوەی لە کویٚ؟** : ابـن مـسعود ﷺ دەفەرمـویٚ: لەبـەر کـردنی قـورِئان لەسـەردەمی

ئـێمە زۆر قـورس بوو، بەڵام کار پێ کردنی ئاسان بوو! بەڵام ئەوانـەی دوای ئـێمە، لەبـەر کردنیان لا ئاسان بوو، وەلێ کار پێ کردنیان لا قورس بوو! ( الجامع لأحكام القرآن )

٤. **شعبه بن الحجاج بن الورد** ( رحمه الله ) هەموو جار بە ئەهلی فەرموودەی دەفەرموو: ئەی گەلینە! ئێوە چەندی لە زانستی فەرمـوودە پێش ئەکەون، لە قورئان دوور ئەکەونەوە!! ( نزهة الفضلاء )

ئەمـەش ئاگـادار کردنەوەیەکە بۆ ئەو کەسانەی کە دیراسەی ئەسانید ئەکەن.

٥. **محمـــد بـــن كعب القرظي** ( رحمه الله ) **خوێـندنەوەی چەند کورتە سـورەتێکی لا خۆشـترە لــە خوێندنەوەی هەموو قورئان !!** :
دەیفەرموو: شەوانە تا بەیانی گەر تەنها سورەتی ( إذا زلزلت ) و ( القارعـــة ) بخوێـنمەوە و لەوەنـدەش زیاتـر تـێ نەپەڕم پێم خۆشـترە لـەوە کـە هەمـوو قـورئان بەپەلـەو بـە خـۆ بـادان بخوێنمەوە! ( الزهد لإبن مبارك ).

٦. **کــە قــورئانت خوێــند هــەوڵ دە کــە بگــریەت!** : ئیمامـی غەزالـیش ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێت، دەڵـێ: گـەر قـورئانت خوێـند هەوڵـدە کـە بگـریەیت، خـۆ ئەگـەر نەشـگریایت، ئەوا

بگریه بەسەر ئەم دڵەی کە تا بە فەرمایشتی خواش نەرم نابێت و ناچڵەکێت.

## چۆن لە قورئان وورد بینەوە؟

پێویستە کە مسوڵمان قورئان ئەخوێنێتەوە، هەمیشە لێ ی وورد بێتەوەو پیایا قوڵ بێتەوە، قورئانێک کە نامەیەکی خواییە و بۆ گرۆی سەر زەوی هاتووە، ئەبێ بزانیت کە چی تیاو فەرمانی بەچییە. هەڵبەت زانینی ئەم ڕاستیەش تەنها بە وورد بوونەوەو تێ فکرین ئامانجەکە ئەپێکێ، بۆیە بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ لە قورئان بنەوەو لە قورئان تێ بگەن ئەبێ ئەم خاڵانەی خوراوەوە لە بەر چاو بگرن:

١. **لەبەر چاو گرتنی ڕەوشتی قورئان خوێندن**: واتە: بە لەش پاکی و بە تێ فکرین و بە ئەدەب و ڕیزێکی زۆرەوە ڕوو دە قورئان کەیت و دەوری کەیتەوە. ترسان و هەست کردن بە گەورەیی ئەم قورئانەو، بیر کردنەوە لەوە کە ئەم قورئانە کەلامی خوایە، بەشێکن لە ڕەوشتی قورئان خوێندن.

٢. **لە کاتی خوێندنەوە پەلەی تیا نەکەیت** : و ئەبێ بە هێوری و لەسەر خۆیی بە بێ پەلە ئایەت بە دوای ئایەت بخوێنیتەوە، پەلە کردن زۆر جاران ئەبێتە مایەی هەڵەکرد و ئەشبێتە مایەی حاڵی نەبوون لێ ی.

**٣. وەستان لە بەردەم ئایەتەکان و وورد بوونەوە لێ یان.**

**٤. تێ ڕامانێکی هەمە لایەنە لە ڕووی ( تەرکیبی و ماناو کات و هۆی دابەزین و.. هتد )**

**٥. دوور بینـینی ئایەتـەکان**.. وا بکـە کـە ژیـانی ئینسانی تیا ببینـیت وچارەسـەری گـیرو گـرفتەکانی ڕۆژانـەی تیا ڕەچاو بکەیت.

**٦. بە تێگەیشتن و فەهمی سەلەف بۆ مانای ئایەتەکان بچیت.**

**٧. ئاگـادار بـوون لە ڕاو بۆچوونی هێندێ لە ڕاڤە ( تفسیر ) کارانی قورئان.**

**٨. بیر لە ئامانجی ناردنە خوارەوەی قورئان بکەیتەوە.**

**٩. مـتمانەی تـەواو بـە دەقـەکان و مـل کەچـیەکی تەواو بۆ فەرمایشتەکانی.**

**١٠. وەک دووهاوڕێی گیانی بەگیانی لەگەڵ بژیت.**

**١١. چەن جاران بەسەر ئایەتەکان دا بگەڕێیتەوە، مانای تازە تروو نوێترت پی ئەبەخشێت.**

**١٢. هــەوڵ دە کــە شــارەزای زانــستەکانی قــورئان بــیت:** لــە ئەحکامــەکان و موتەشــابیهـ و ناسـخ و مەنـسوخ و هۆیەکانی دابەزین و.. هتد

**١٣. هــەوڵ دە کــە ئەم کتێبانە پەیدا کەیت کە فەهمی زیاترت پێئەبەخــشن دەربــارەی تــێ گەیــشتنی زیاتــر لــە قورئان:** چــاکترین کتێـبیش بـۆ ئـەم مەبەسـتە، ئـەم کتێـبانەن ( القواعد الحـــسان لتفسير القرآن ) ی سعدی و ( مفاتيح للتعامل القرآن ) ی خـالدی و ( قـــواعد التدبـــر الأمثل لكتاب الله ـــ عز وجل ) ی عبدالـرحمن حبـنکە المیدانی. یان کتێبی ( دراسات القرآنية ) ی محمد قگب.

## هێڵە سوورەکانی تێگەیشتن لە قورئان؟!!

کاتێ کە ئێمە باس لە فەهمی قورئان ئەکەین، ئەبێ ئاگاشمان لـەوە هـەبێت، کە زۆر باس لەقورئاندا هـەن، نەک هـەر لـەسەر مان واجب نیە کە تێ ی بفکرین و تەفسیری ئەقڵی بۆ بکەین، بگـرە خـەتی سـوورەو درووسـت نـیە هەر تخونی کەوینەوە. لەوانە:

١. نابێ ناو و سیفەتەکانی خوا (تحريف و تعطيل و تشبيه و تكيف) بکرێن؟ مەبەستیش بەم شێوەیە:

- (**تحريف**) واتە: نابێ ناو و سیفەتەکانی خوا دەسکاری بکرێن و بەبێ کەم و زیاد و گۆڕینی سەر (فتحە) و بۆر (چمە) بۆ ناوەکانی واتە ئایەتی: [ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَي تَكْلِيماً ] النساء: ١٦٤. بکرێت بە [ وَكَلَّمَ اللَّـهَ مُوسَي تَكْلِيماً ] هەروەها نابێ بە جۆرێک ( تأويل ) بکرێن، کە مانای ئەسڵی یان نەمێنێ.

- (**تعطيل**) واتە: (لە کار خستن) ئەمیش بریتی یە لەوە کە نابێ لابردن و ئینکاری کردنی ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە بکرێ، ئەو تاقمەی کە (**تأويل**)ی ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە دەکەن (**جهمي**)یان پێ دەڵێن.

- (**تشبيه**) واتە: (وێچواندن) ئەویش ئەوەیە کە نابێ سیفەتەکانی خودای گەورە بە دروست کراوەکانی بچوێنی وەکو ئەوەی کە دەست و گوێ و بینینی (خوا) وەک دروست کراوەکانی سەیر بکەی.

- (**تكيف**) واتە: (چۆنیەتی) ئەویش ئەوەیە کەنابێ لە چۆنیەتی و هەقیقەت و ناوەرۆکی سیفەتەکانی خوا بکۆڵیتەوە.

٢. پێویــستە ئاگــادار پێــنج خــاڵ بــیت لــە ڕووی نــاوو سیەفەتەکانی خوای پەروەوردگارەوە:

- **قــسە کــردن لەهێندێ سیفەت وەکو قسە کردنە لەهەموو ســـــیفەتەکانی**: بــۆ نمــوونە: دان بەهێـــندێ ســـیفەت لەسـیفەتەکانی خـوا بهـێنێ و پاشـان بڵـێین ئەمانـە سـیفاتی هەقیقین. وەکو ( الحیاة و العلم و القدرة و السمع و البصرو الكلام الإرادة ) بــەڵام (خۆشەویــستی و ڕەزامەنــدی وتــوورە بــوون ورق هەڵـسان) بـە سـیفاتی (مجـازی) دابنێین!! بێگومان هەڵوێستی ئـەم کەسـانەش وەک ئەوە وایە کەدان بەهیچ سیفێتێکی خوا نەنێن؟! هـەروەها ئەوانـەی دەڵـێن خـوا نـاوی (حي) یە بە بێ ئـەوەی سـیفەتی بێ، یـان نـاوی (علیم) ە بـەبێ ئەوەی سیفەتی (علـم )ی هـەبێ، دیـسان ئەوانـە وەک ئەوانـەن کـەدان بەهـیچ سیفەتێکی خوا نەیەنن.

- **قــسە کــردن دەربــارەی ســیفەتەکانی خــوا قسە کردنە دەربــارەی زاتی خودا** : واتە: هەرچی دەربارەی سیفەتەکانی خـوا بگوترێ ئەوا دەربارەی زاتی خوا گوتراوە. بۆ نموونە: کـاتێ کەخـوای پـەروەردگار دەفەرموێ (خوا لەسەر عەرشە) بـەڵام یـەک بڵێت نەخێر خوا لەسەر عەرش نییە!! ئەوە وەک ئەوە وایە کە نکۆڵی لە بوونی ( وجود) ی خوا بکات!!

- **لــەکار خــستنی (تعطــیل) ی ســیفەتەکانی خــوا، خــۆی لەخــۆیدا بــاوەڕ بــوونە بــە وێکــچوون (التــشبیە):** چـونکە بــاوەڕی وایــە کــە ســیفەتەکانی خــوا بەســیفەتی دروســت کراوەکانی دەچێ بۆیە لەکاری دەخات.

واتــە: پــێش ئــەوەی (**تعطــــیل**) ی ســیفەتەکانی خــوا بکــات، سـیفەتەکانی خـوای گـەورەی (**تـــشبیە**) کـردووە بـە دروسـت کـراوەکانی. چـونکە (**تعطیل**) کـردنی سـیفەتەکانی خـوا بۆ خۆ ڕزگار کردنە بە وێک چواندن بە دروست کراوەکانی خوا.

- **ئایەتـــەکانی قـــورئانی پـــیرۆز دەربـــارەی ڕوالّـــەتی ســیفەتەکانی خوا لیوێکچووەکان (المتشابە) نین:** واتە هیچ ئایەتـێک لـەبارەی سـیفەتەکانی خـوا نییە مانای دیار نەبێ. تاوەکو پێویستیان بە (**تأویل**) هەبێ..

**هەقیقەتی (تاویل)**

بـەواتای سـەرەنجامی ڕاسـتەقینەی هـەر شـتێک دێت لـەدوا قۆناغــیدا، بــۆ نمــوونە ســەرەنجامی ڕاســتەقینەی ئینــسان زینـدوو بـوونەوەیەتی لـەڕۆژی دوایـی ئەمـەش هەقیقەتێکـی قورئانیـیە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَمَّــا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُه ﴾ یونس٣٩. واتە: هێـشتا بـۆیان نەهاتووە لە سەرەنجامی بڕوا نەهێنانەکەیان.

یـان دەفەرمـویٚ: ﴿ هَــلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ ﴾ الأعراف: ٥٣. واتە: ئایا بیٚ بـــڕوایان چـــاوەڕوانی هـــیچ شـــتیٚ دەکـــەن جگـــە لەدوارِۆژ وسەرەنجامە ڕاستەکەی؟

❁ ❁ ❁